(سورەی الواقعه)

نۆبەی (تفسیر)ی (سورەی الواقعه)یە، (مکّی)یە، گشتی، یا (ما عدی)ی چەند (آیەت)ی لە (مکّە) (نازل) بووە، گۆیا لەبەر (سبب)ی (نزول) ئەبێ لەوێ (نازل) بووبێ، باشە، بۆ لەو (سورەت)ەدا دانراون؟ (سبب) چیە؟ بڵێم: "چی؟!" ئێمە ئەنۆڕینە (نظم)ی (حاضر)ی (منظوم)، (مکیّە)، (مدنیە) (مختلطه)، (علی السّوا)یە، (عدد)ی (آیات)ی (حسب إختلاف)ی (حجازی) (معه) (شامیّ)و (بصری)و (کوفی) لە (٩٦) کەمتر نیە، لە (٩٩) زێتر نیە، (رحمەت)ی خووایان لێ بێ، کەم بەلای (إتّفاق)ەوە ئەڕۆن. (مناسبه) (ظاهره).

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١﴾﴾ کە ئەوەی ئەبێ، بوو، هاتە جێ (نجوم) (سقوط)یان کرد، مانگ (شق) بوو، ئاسمان تاوایەوە، ئاگر باران کرا، چ مایەوە؟ (طامّەی کُبری)، ئەویش (أنه) ئەوا بوو، کە (قیامەت) ڕابوو، شەق و شڵق کەوتە (عالم) ﴿لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾﴾ گەڕانەوەی نیە، کەس ناتوانێ (مدافعه)ی بکا، کەسێ (جبّار)ی (عنید)ە، (قوّی)و (ظالم)ە، لە جاڵجاڵۆکەی بێ دەسەلات ترە ﴿خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾﴾ بڵندان نەوی ئەکا، نەوی یان بڵند ئەکا چ: (معنوی)، چ (حسّی)، (بعض)ێ بۆ (درجات)ی (عالیه)، (بعض)ێ بۆ (درکات)ی (سافله) ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾﴾ کەوتە بومەلەرزە، (حرکە)یە (شدید) وەکی (زلزله)یە، (أرض) بخاتە تێك چوون، ئەو (أرض)ەی کە خوا بۆ (أنام)ی دانابوو، (إمرار)ی (حیات)یان لەسەر ئەکرد ﴿وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾﴾ هەڵوەری ﴿فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾﴾ (غبار)ێ بڵاویوەوە، وەکی ئەو

---

تۆزێ ناساغ و(محزون) بووم (أما الحمد لله) ڕوو لە چاکیمە، خوا چاکی کا، آمین.

ورده ورده‌ی، له تیشکی ناو خانیان ئه‌ی بینن، (ذاتاً) گه‌لێ چیا زۆر پیر بوون، (وه‌قته) به ته‌واوی له‌به‌ر عه‌ردی یه‌کسان بن، خوا ئه‌زانی (ذرّات)ی بۆ کوێ چووه؟ چی لێ هاتوه؟ ئه‌و زورگی (أطراف)ی ولآتی مه، هه‌مووی وان، (حتّی) چیای (سفین)ی له (جهه‌ت)ی (غرب)ی (شقلاوه) دیاره بوویته، زه‌وی، چیای (باواجی) ئێمه‌ش له‌و (جهه‌ت)ی زۆر نوێ بوه، سه‌ری بوویته گۆڕه‌پان، ئه‌وا له (پیرمه‌م)ی (قصر)و (قصور)ی (صیفی)، لێ دروست ئه‌که‌ن، بۆ (ملك)ی وه‌(حواشی) (ملك) داری، به (واسطه)ی دارو (نبات)، (عومر)یان نه‌ختێ درێژ ئه‌بێ ﴿وَكُنتُمْ﴾ (ظاهر) وه‌یه، (خطاب) بێ، بۆ (أمّه‌ت) گه‌رچی (أكثر) ئه‌فه‌رموون: "(عامّ)ه له هه‌موو (أمم)" چ (قیدی)یه (خطاب) بۆمه بێ، (أمم)ی تریش وابن ﴿أَزْوَٰجًا﴾ (أصنافاً) ﴿ثَلَٰثَةً ۝٧﴾ (إجمالاً) (تقسیم) به (إعتبار)ی (أوصاف)ی (متقابله)یه، ئه‌وانه (أصحاب الميمنه)، (أصحاب المشأمه)، (سابقون) ﴿فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ﴾ (خێر)و (برکه‌ت)و (سعاده‌ت) ﴿مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ۝٨﴾ چن؟ خوا ئه‌زانی له (حال)ێ خۆش دان، له (حیات)ی (دنیا)، ئه‌وانی (أصحاب)ی (یمن)ن، (متفائل)ن، (نظر) به (أصحاب)ی (مشأمه)، ئه‌وانی (متشائم)، (عادة) وه‌ك له به‌هه‌شت دابن، وان (متشائم)ی وه‌کی (إبن الرومی) زۆرن، (حیات)یان (إغوا)و (جحیم)ه ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾ شووم و (نحس) ﴿مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ۝٩﴾ له (نهایه‌ت)ی ناخۆشی دان، (تقدیر) ناکرێ ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ﴾ (قسم)ی (ثالث) ﴿ٱلسَّٰبِقُونَ ۝١٠﴾ له هه‌موو (أسباب)ی (سعاده‌ت)و (خێرات) (سبق)یان کردیه ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئه‌وانی (سبّاق)ی (غایات) ﴿ٱلْمُقَرَّبُونَ ۝١١﴾ (نظم)ی (عباره‌ت)یشیان جودایه. ئه‌وه‌ی ته‌ماشای (خێر) بکا، به (نظر) (زه‌مان)ی خۆی و بیکا، ئه‌وه (سابق)ه ئه‌مڕۆ بۆ (مسلمان)آن، نوێژو ڕۆژی، گه‌رچی (أساس)ن، (مولود) کردن —(خصوص) به ناوی

(أوليا)يان– (خێر)ێ نين، (إنسان) پێى ببێ، به (سابق)، (دين) له نوشسته (علم)ى (إسلامى) له (إنقراض)ە، دوشمن (دين)و دەمى (قوى)يە، به (أسباب)ە ئەوەى (مقابله)ى وانى پێ بكرێ، ئەو (خێر)ە، ئەو (سبق)ى تيايه، ئەوەى بۆ (توحيد) تێ كۆشێ، (مؤمن)ە، له (مسابقين)ە، (سَدُّ الذَرايع) له (أسباب)ى (سبق)ە (وكذا إختراع)، ديمان به (إختراع) كوو (سبق)يان كرد، ئێمەش به (إختراع)ى درۆو دەلەسان، چۆن دوا كەوتين ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ۝١٢﴾ هەرچى (خيال) كەى (داخل)ە ﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝١٣﴾ (جماعەت)ێ زۆر له (صور)ى (أمّەت)، (إبتدا)ى (تشكيل)و (تعالى) ﴿وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ۝١٤﴾ (قرناً بعد قرن) كەم بوون، باوەڕ ناكەم ئەمڕۆ له رووى زەمين، كەسێ هەبێ (داخل)ى ئەو (زمره)يەبێ، هەمووى كۆنەكاى بەبا دەكا، (نهاية النهايەت) (ذات)ێ وەكى (طنطاوى) به (سليقه)و مەراق (مطالعه)ى (جرائد)و (مجلات)و (رسائل)ى (ئاوروپايى)يان بكا، ئەوەى ئەوان دەيلێن، بيهاوێته (تفسير)و (دەعوەت)ى (مسلّمان)آن بكا، بۆ ئاگاى لێ بوونى، ئەو (علوم)آنەى كه (أجانب) (تدوين)و (إختراع)ى ئەكەن زۆر باشه، (أما) ئەويش (مع الأسف) بەناوى (دين) (تكفير) ئەكرێ. (مجادله)ى (بدعەت)و (سنّەت) واى (عوق) كردن، به جارێ پێى (سبق)ى بەستن (حتّى) واى لێ هاتيه، ئەگەر كەسێ، (قوم)ێ، ئارەزووى (سبق) كەن، ئەبێ له (دين) دەرچێ، ئەوجا شەقاو باوێن، بۆيه (مستشرقين) وا (طعن) له (دين)ى (إسلام) ئەدەن، ئەڵێن: مايەى (جمود)ە، (مانع)ى (ترقّى)يه" ئۆبالێ به ملى ئەوانەى وايان بەسەر هێنا. بەڵێ (لازم) بوو، لەسەرى هەر (قرن)ێ (مجدّد)ێ، (مجدد) (نظر) به (أحوال)و (ظروف)و (حال)، (وملاحظه)ى (إستقبال)، وەهەم (قيامەت)، بۆ (دوام)ى (عزّ)و (إقبال)ى (أمّەت). (مسلّمان) كه (دنيا)ى بوو، (قيامەت)ى ئەبێ، (الدنيا مزرعة الآخرة) (دين)ى (إسلام) به (زلّەت)و (مسكنەت) نازێه (لله العزّة ولرسوله وللمؤمنين) (خَير أمة أُخرِجَت للناس) چۆن ئەبێته، ژێر چەپەلۆك؟! (مجددى)

تەنها بە مەلایەتی نابێ، (قدرەت)و (قوّەت)و (ورع)و (تقوی)ی گەرەکە، وەکی (عمری بن عبد العزین)، (حضرەتی شافعی) (ملا) بوو، تەواو (لکن) ئەم (قدرەت)ەی نەبوو، (اَلقُوَّة، اَلقُوَّة) (قوّەت)ی (مادّی)و (معنوی) رێك کەوێ، خۆیەتی، بەڵێ (أولو العزم)ی وەکی (هتلر)و (موسولینی) (لازم)ە، (أما) (أمّەت) وەکی (ألمانی)و (أیطالیا)یی نین، زۆر (متفرق)ن، گرد کردنەوەیان زۆر (مشکل)ە، (خصوص) تا ئەو (نوع)ە (شێخ)و (ملا)یانە مابن، (محاڵ)ە ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾﴾ لە (جنّات النعیم)دا، تەخت و قەنەفەو ئاورەنگی خوسرەوانی، وەکی پارچەیی دیبا، تەندریایی، (منقوش)و (منتظم)، باوەڕ ناکەم، لە زەمانی (رسالەت پەناە) تەخت و کورسی، ناو هوندرایەوەو تەندریایی بە حەیزەران، باشێدی بوویێ، ئەمە تازەیە، (سبحان اللّه) لە (قاموس) بنۆڕە (وَضَنَ) ﴿مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا﴾ لەسەر تەختان ﴿مُتَقَـٰبِلِينَ ﴿١٦﴾﴾ ئەمبەر و ئەوبەر، بەرابەر یەك، لەسەر (أرائك) بە (کمال)ی (إستراحەت) دادەنیشن، پاڵ دەدەنەوە، (تجملات)ی ئێستا پەیابوە، ئەڵێی لەسەر وێنەی بەهەشتی دروست کراون ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾﴾ لەسەر (حاڵ)ی خۆ ئەمێنن، ئەو (خزمەت)ە، بە (کمال)ی (سرور)و (مباهات) (تلقّی) ئەکەن، بەسەریان دادەگەڕێن ﴿بِأَكْوَابٍ﴾ پیاڵە، بادەی هەر (شرب)ێ، ئارەزووکەن ﴿وَأَبَارِيقَ﴾ مەسینە، بۆ گوڵاو بە خۆداکردن، دەست وڕوو شوشتن، بەس بۆ (التذاذ) ﴿وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾﴾ (عیون)ی (جاریە) ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا﴾ سەریان نایەشی ﴿وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾﴾ سەرخۆش نابن ﴿وَفَـٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾﴾ هەمووی (مختارە)، (ممکن)ە، زێدە (ممتاز)ی هەبێ، وە(عجایب)ە، (إنسان) (مطلقاً) لە میوە دەست گێڕی دەکا، (ولو) هەمووی (میوەی) نایاب بێ، (بعض)ەکی لە (بعض)ەکی جوانتر دێتە بەر (نظر) ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا

يَشۡتَهُونَ ﴿٢١﴾ (ممکن)و ئەوانە لە (مجلس)ی (إنس)، (ولدان)آن لە (خدمەت)یانا، بگێرن، وەکی (قالدرقۆی) (دنیا) (خلاصه)، (جنان)ی (وسیع)، (عومر)یّ بیّ (نهایەت)، (نعَم)یّ زۆر، بە گەلیّ (نوع)آن، ئەخوریّ و ئەخورێتەوە، (ممکن)ە بلّێن: "(جنابی حق) کوو (خمر)و (لَبَن)و (عَسَل) بە (طَرز)یّ (غیر)ی (طرز)ی (دنیا) (خلق) ئەکا، گۆشتیش بەو جۆرە، وەکی دونبەلان و کوارگی عەردی، لە گۆشتی (لذیذ) ترن، (خلق) کا" با(طیر)و تواری بەهەشت نە کوژینەوە ﴿وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾﴾ هەریەکە شی خۆی، چاو جوان ﴿كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِ ٱلۡمَكۡنُونِ ﴿٢٣﴾﴾ دلرژێن لە (لۆلۆ)ی (صاف)و (محفوظ) ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾﴾ دیارە (لا أبالی) نیە، (جزا)ی (عمل)ە، لە (عالم)ی (تشریعی) خوا وای داناوە، (مقام)ی (قهر)و (غلبە)و (لا أُبالی)و (لا يُسأل)، (مقام)یّ ترە. (ایمان)ی بیّ (عمل) وەکی دارێکی بیّ بەرە ﴿لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا﴾ (سابقون) ئەمە (داخل)ی (جزا) نیە، (حسن)ی (أدب)ە لە (جنان) ﴿لَغۡوٗا﴾ (لغو الیمین، لغو الحدیث) قسەی بیّ هوودە، بیّ (معنا)، پڕو پووچ ﴿وَلَا تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾﴾ (کلام)ی (قبیح)، کە بی لێی، بلّێن: "خراپت ووت" نە بە (مبالغه) لە (تعظیم)و نە بە (تحقیر)، (أجَلّکم الله) کوردیّ هات، سۆزم یابانە، بیر (عەرەب) گێتی، ئاوا ﴿إِلَّا قِيلٗا﴾ (قولاً) ﴿سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴿٢٦﴾﴾ (أنه) ئەمە (لغو)ە، (سَلامٌ عَلَيكم طِبتُم فأدخلوها خالدین) بەجێیە، (أول)ی (سلام قولاً من ربٍّ رحیم) (فوق الکل)ە، (باقی) (سلاماً سلاماً) (نوع)ە (إطناب)ێکە. ئایا ئەوانەی بە (غلّ)ە وەڕی خوو ئەگرن، دیارە (داخل)ی ئەو (قسم)ە نین، ئەبیّ کوردەکان وعەرەبەکان و هەولێری، کوو قسان بکەن لە بەهەشتیّ؟ (بلا معنا)یەکی، (عەیب) نەبیّ، هەرامە، هین، گوێت لیّ بیّ، تیّگەیشتی؟ (سیشمە، فهمت؟ گول: أنت)، ئیشتە بە توو بلّێمەوە شت! واچاکە (إنسان) فێری قسان ببیّ، دیارە بەهەشت (لغو

الکلام)ی تیا نیە ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ﴾ (قوەت)ی راست لەلای راست دانان (علامەت)ی راستیە، ئەو (ذوات)ی شوێن (رعایەت) ئەکەن، (قدر) شوناسن هەر کەسە لە شوێنی (مناسب)ی (حال)ی خۆی دادەنێن ﴿مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ ٢٧﴾ بڵێین: "چی؟" جای (تعجّب)ن، (محیّر)ن، (رفیع القدر)ن، بوڵوند (منزلەت)ن ﴿فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ٢٨﴾ بێ درک، کەم وایە لە (دنیا) داری میوە، خۆش درکی نەبێ: (پرتقاڵ، لیمۆ)، (سائر)ی (أنواع)ی هەرمێ و هەنار. (طبیعی) لە (جنّەت) ئەو (شۆکە)یەش نامێنێ. دراو درەختەتی بە (شوکەت)و بە (زینەت)و بەبەرو بێ (أذیّەت)ە ﴿وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ٢٩﴾ داری بەری گەورە گەورە، (ثمر) چین چین، بەسەر یەکا هاتوە، بە (مۆز)یش (تفسیر) کرایتەوە ﴿وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ٣٠﴾ ئی داری زینەت و سایە داری سەروو سەمەن و یاسەمین و عرعر وشمشادو سایە بان و قەڵەم تۆز، سایەی (جنان) کورت نابنەوە، چونکی (تابع)ی (حرکە)ی (منوّر)ی نین، وەکی ڕۆژ بخولێتەوەو بوڵندو نەوی بێ، سێبەری پێ بگۆڕێ، (أما علی کل حال) ئەبێ (ضیا)ی تیا هەبێ ﴿وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ٣١﴾ (قابل)ە (شلاّل)ە بێ (ممکن)ە لە (جنان) (مواقع)ی هەبێ، وەکی شاخی (دنیا)، با لە یاقوت و زوبورجود و مەرجان بن بنەوەی (حوض)ی (بلّور)ی، (أطراف)ی (صرح) (مُمَرَّد) لە (قواریر)، لە بلندیەوە، وەکی سوولی (چنارۆکی) ئێمە، وەکی ئاوی (خانە)ی وەکی سەرچاوەی (زێوە)ی (بێتواتە)ی، (سولاف)ی (عمادیە)، ئاوی (صاف)و (برّاق) هەڵڕژێتە خوارێ، (حقاً) (زینەت)و (شوکەت)و (نشأە)ی هەیە، جارجار بی چیتێ، خوا (نصیب)مانی کا، لێی دانیشین، بە (کمال)ی (سرور)، لەگەڵ یاران چایەی ئەرغەوانی ڕەنگی تیا (عافێت)کەین،، خوایە چۆن چایی (ممتان)ت پێ (کرم) کردینە لە (دنیا)، (سوول)ی پاشای (چنارۆک)ی، (نظر) بە (جنان)یش جێی وا (ممتان)مان لەو وێنەیە پێ (إحسان) کەی، کە (جنّەت) ئاوی کوفارەی

هەبێ، ئەبێ (شلاّله)شی ببی، (ممکن)ە (مفسرین)ەکان بە دڵیان دا نەهاتبێ ﴿وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ٣٢﴾ بە (أنواع)و (أجناس) ﴿لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ٣٣﴾ نابڕێ، (دائم) هەیە، کەسێ لێی (منع) ناکرێ، وەك باغاتی (دنیا) نیە، ئەگەر بەیەك دەست نەچنرێ، تێك چێ و خراپ بێ، میوەی زوو ببڕێ ﴿وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ ٣٤﴾ (أنه) (فرش)ی (خلوەت)، (رفیع)، کەس دەستی ناگاتێ، وە(صاحب)یان ئەوەندە (مستور)ن، نابیندرێن، مەگەر لە (فرش) (فهم) کرێن ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ﴾ خوا بە (صانعی) خۆی ئەفەرموێ: "ئێمە ئەوانەمان، (أنشا) کردیە" ﴿إِنشَآءٗ ٣٥﴾ لە (حسن)دا، بێ (شبیه)و (نظیر)ن، (تعریف)و (توصیف) ناکرێن، لە (آثار) وادەرئەکەوێ، ئەمانە ژنی (دنیا)ن، لە (جنان) (نشأت)ی تریان هەیە (حقّاً) ئەگەر ئێمە بێ (وفا) نەبین، (أولاً) چاومان لە (حرم)آنی خۆمان بێ، بە (حوری)یان نەگۆڕینەوە، ئەمرۆ لەگەڵ یەك ئەژین، (حوری) (مرحبا)مان لێ ناکەن، سبەی ببنە هەوێیان، وەبۆیان (ترك) کرێن، نابێ، ئەبێ (أعز) بن ﴿فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ٣٦﴾ کچ و دۆست نازن ﴿عُرُبًا﴾ خۆ خۆشەویست کردن، بەغەنجەو (دلال)و گوفتاری ئابدار، بە لێوی شەکەر بار دڵی مێردیان ئەفرێنن (أخلاق)یان ئەگۆڕێ، (أکثر)ی ژنی (دنیا) دورشت خوون قسەیان ڕەقن، دڵ لێیان هەڵدەنگوێ، (إنسان) پێی گرژ ئەبێ، ئەم دژ خوویە —(طبیعی)— لە بەهەشت نامێنێ، بە (أحسن)و (ألین) ئەگۆڕێ ﴿أَتۡرَابٗا ٣٧﴾ هەم (عومر) هەمووی ئەڵێی کچی چواردە ساڵین، دیارە تا (تقارب)ی (خلق) نەبێ، (تقارب)ی (خُلق) نابێ، (بشر) بۆیە ڕێك ناکەون (مزاج)یان، (أعمال)و (مشارب)یان لێك دوورن هەرچەند (رسل)و (رجال)ی (إصلاح) تێ کۆشن، (بشر) ڕێك ناکەون، (خصوص) پاش (تباین)ی (دین)ی و (سیاسی)و (تمکّن)ی (تباغض)و (تحاسد)، گەر خوا ئارەزووکا بە (أحوالات)ی (تکوینیه) لێکیان نێزیك کا، بە (أحوالات)ی (إداره)و (تعیّش) پێك دێن ئەو

هەموو نازو (نعمەت)ە ﴿لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ٣٨﴾ چەند فەرموودەیان هەیە، بۆ (متعلّق)ی (لام) ﴿ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ٣٩ وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ٤٠﴾ ئی ئەو (أمّەت)ە، ئی (أمّەت)ەکانی تریش، ئەگەر (دوام)یان بووبێ، وابزانم ئەو (کلام)ە، (إشارە)یە، بۆ (علّەت)ی (مکافات)یان، (غایەتی) وەکی (سابقین)آن (صریح) نیە، دیارە ئەم دوو (ثلّة) (داخل)ی (سابقین)آن نین، (بعض)ێ (روایات) هەن، (عبارەت)ی (قرآنی) (ردّ)ی ئەکا ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ٤١﴾ مەپرسە، هەرچی (مسلّمان)ە، بە (حالّ)یان نەبێ ﴿فِي سَمُومٖ﴾ بای زەهر ئالوود ﴿وَحَمِيمٖ ٤٢﴾ ئاوی گەرم، دەروون ئەکوڵێنێ، پێستی هەڵ ئەدا ﴿وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ٤٣﴾ دووکەڵی رەش، وەکی دووکەڵی پاپۆڕی، ئومێدە (پاریسی)و (لۆندەرەیی) هەموو بکەونە ژێر ئەم سێبەرە، کوو لە (دنیا)یە دووکەڵی فابریقە (دەور)یان ئەدا لە (قیامەت)یش ئەوها ﴿لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ٤٤﴾ نە سارد، نە (نافع)و خۆش لە (دنیا)یە (مدافعە)ی ئەکەن، جێی فێنکیان هەیە، لەوێ نابێ، لە (بعض)ە (إنکلین)آنم ئەپرسی: ئێرە خۆشترە، یا(لۆندەرە)؟ ئەیان ووت: ئێرە، ئێرە هوای (صاف)ی هەیە، (نور)ی (شمس)ی بە (دوام) لێ ئەدا." بەڵێ (مدنیّەت)و بێ (دینی)، جێی وەکی (لۆندەرە)ی کرد، بە (جهنّم) بێ (نور)ی (شمس)و بێ (هوا) ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ﴾ لە (دنیا) ﴿مُتۡرَفِينَ ٤٥﴾ (نفس) بەرەڵا، ئەوەی هەوەسیان بایە، ئەیان کرد، (مانع)و (رادع)و (قارع)و (زاجر)ین نەبوو، (قیلَ مُستَکبِر) لە (قبولّ)ی (حق)، (قیلَ مُتَنَعِّم) هەمووی ڕاستە، دوای هەوا ئەکەون، (دەعیە)یان نایەنێ، (نفس)یان (قبولّ)ی (حق) ناکا، بە (تحدید)ی (دین)و (شرع) (راضی) نین، ئەمە (حرام)ە ئەمە (مالّ)ی (یتیم)ە؟ گوێی نادەنێ، (أصحاب)ی (شمال) –(ولو) (فقرا)شیان تیابێ– هەر گوناهێ بیکا، لای زۆر (لذیذ)ە

(عیش)ی بێ (غم)و (کدر)ە، (نظر) بە (مؤمن)، (حتّی) ئی دەوڵەمەندی کە لە (نعمەت) دایە، (مؤمن) حەقیقەت ئەگەر زۆریش بە (دەوڵەت)و (نعمەت) بی، (لذّەت)ی نیە، مەگەر لە (غفلّەت)، لە (عاقبەت)ی ئەترسێ، لە (أدا)ی (شکر)ی (عاجز)ە ئەترسێ (إستدراج) بێ، لە (حساب) (خوف)ی زۆرە ﴿وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾﴾ گوناهی گەورە گەورە، لە (تفسیر)ی (إبن جریر) (تفسیر) کراوەتەوە بە (شرك) وە(سیّد) لە (تاج)ی (سبُکی) (نقل) ئەکا: (سؤال)ی لە بابی (تقی الدین سبکی) ئەکا، لە (معنی)ی (حنث)، ئەفەرموێ: سوێند لەسەر (إنکاری) (بعث)، (کأنه) (تمهید)ە بۆ ﴿وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا﴾ کەوڵ و پێستمان ڕزی، بوە خۆڵ ﴿وَعِظَـٰمًا﴾ هێسکمان ما، بووینە هێسکی رووت، ئەویش ئەڕزێ ﴿أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾﴾ زیندی ئەکرێینەوە ئەوانە هەرچەند (إنکاری بعث) ئەکەن، (ولو) (هیکل)ی (بشری) بمێنێ، وەکی (هیکل)ی (فراعنه)، (أمّا) (إشاره)ی بۆ (تقویه)ی (إنکار) (أنه) (دلیل) ئێنن، لەسەر (إستحاله)ی ﴿أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾﴾ ئەوانیش زیندی ئەکرێنەوە، چۆن؟ هێسکیشیان نەماوە، لەگەڵ (هوا)و ئاوو عارد تێکەڵاو بووین، (فرق) ناکرێن، بەڵێ بۆ ئێمە (فرق) ناکرێ، (أما علم)ی (نافذ)و (محیط) (تعریف)ی ئەکا، (أستاد)ی (أعظم)ی (کیمیا) خڕیان ئەکاتەوە. نەختێ قسەیان لە (عطف)ی ئەو (کلام)ە کردیە ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ (مِنْ لَدُنْ آدم) ﴿وَٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾ (إلی إنقراض العالم) ﴿لَمَجْمُوعُونَ﴾ کۆ ئەکرێنەوە ﴿إِلَىٰ مِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾﴾ ڕۆژی (قیامەت) (معلوم) ئەبێ، (أما) (تعیین)ی (یوم)و (وقت)ی بۆ کەس نەکراوە، (غیر)ی خوا کەس نایزانێ ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ﴾ ئەی گومڕاهان ﴿ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾﴾ بە (بعث) ﴿لَـَٔاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾﴾ تاڵ،

وەکی ژەقنەبوت ﴿فَمَالِـُٔونَ مِنۡهَا ٱلۡبُطُونَ ٥٣﴾ زگتانی لێ پڕ ئەکەن ﴿فَشَٰرِبُونَ عَلَيۡهِ﴾ لەسەر ئەو (طعام)ە ناخۆشە ﴿مِنَ ٱلۡحَمِيمِ ٥٤﴾ شتێ زۆر گەرم ﴿فَشَٰرِبُونَ شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ ٥٥﴾ حوشتری تێر ئاو نەبوویی، حوشتر تووشی دەردێ ئەبێ، وەکی (إستشفا)، تێر ئاو نابێ. ئافرەتێ، پیاوێ، (ظاهر) بێ (علّەت) تووشی (بلا)یە بووبوون (علی الدوام) ئاویان ئەخواردەوە، وەهەر تێنی بوون، (حتّی) ئافرەتەکە بۆ (صوم)ی (رمضان) (سؤال)ی لێ کردم، ووتم: "بیشکێنە، وە(فدیە) بدە" (إنسان) (تحیّر)ی ئەکرد، ئەم هەموو ئاوە ئەچوە کێندەرێ؟ چی لێ دەهات؟ وە(بول) کردنیان وەکی خەڵکی بوو ﴿هَٰذَا﴾ ئەوە ﴿نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ٥٦﴾ (حاضر) بە دەست، بۆ (وەقت)ی دابەزینی میوان، تا (أطعمة)ی تر ئەگاتێ ﴿نَحۡنُ خَلَقۡنَٰكُمۡ﴾ ئەوەی بنۆڕێتە خۆی، شت لە خۆی بزانی (یقین) ئەکا، (خالق)ی وی، (ذات)ێ (علیم)و (قدیر)و (عزیز) و (حکیم)ە، بە (طبیعەت) ناکرێ ﴿فَلَوۡلَا تُصَدِّقُونَ ٥٧﴾ (شریك)ی بۆ پەیا ئەکەن، ئەگەر بڕواییتان بە قسەی خوا کردبا، کە خوا (خالق)ی (سماوات)و (أرض)ە تەنها (عبادەت)ی ویتان ئەکرد ﴿أَفَرَءَيۡتُم مَّا تُمۡنُونَ ٥٨﴾ بنۆڕنە (مادّە)یە کە ئەی هاوینە (أرحام) ﴿ءَأَنتُمۡ تَخۡلُقُونَهُۥٓ﴾ ئەو (منی)یە ﴿أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ٥٩﴾ ئاگاتان لێ هەیە، (تکوّن) ئەکا؟ کو ئەبێ، لە چی ئەبێ؟ (حسّ)ی ناکەن، (شعور)تان پێی نیە، باپیر (ملا عبد الرحمن)م، لە (رسالە)ی (إثبات الواجب) ئەفەرموێ: "لە هەموو کەس نێزیکتر لە (إنسان) داك و بابە، لەوان پەیا ئەبێ (مع أنە) باب، ئاگای لە (تکوّن)ی (مادّە) نیە، (إختیار)ی (شعور)ی (قدرەت)ی (مدخل)ی نیە، (أصلاً)، نە داك لە (علوق)ی (تطوّر)ی (تشکل)ی (ذکورەت)ی (أنوثەت)ی، (علم) و (قدرەت)ی پێ هەیە" (حکیم) ئەڵێ: "منداڵ لە ناو زگی داکی، پێش (نفخ)ی (روح)، لە (تحت)ی (إرادە)ی نفسی داکیەتی"

(حاشا) (نفس)ی داکی ئاگای لێ نیه، ئەگەر له (تحت)ی (إدارە)ی (نفس)ی وی با ئەبا بزانێ چی یه؟ چی (لازم)ە؟ کووی پێ ئەگا؟ چۆنی پێ ئەدا؟ (حقاً) (إنسان) وەکی (معمل)ە، (عمله)ی (فطری) ئیشی تیا ئەکا (معمل) ئاگای لێ نیه ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ﴾ (إحیا)و (إماته) له (طرف) یەك خودایه، نه (إله)ی (متعدد) هەیه، نه (صرف)ی (عائد)ی (طبیعەت)ە خوا ئەزانێ ئەمرێ ژین ئەوەندە هەلّ ئەگەڕێ، ئەگەر (قابلیّەت) (مادّە) بووبا، مردنی دانەدەنا، کەس (نجات)ی نابێ، وەبە (غلبه)ی کەس نیه، له (رغم)ی ئێمە ئەوەی ئەمە (إحیا)ی ئەکەین، ئەو بێ مرێنێ، ئەو بێ دەسەلاّتیه، بۆ خودای (قدیر) (محال)ە ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ۝٦٠﴾ (عاجز)و ناتەوان نین ﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ﴾ بگۆڕین، له (طور)ێ بۆ وەی (تحویل) کەین ﴿أَمْثَٰلَكُمْ﴾ له (وهن) بۆ قوّەت، له (حیات)ی (موەقّەت) بۆ (مؤبّد) ﴿وَنُنشِئَكُمْ﴾ سەر له نوێ ﴿فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٦١﴾ ئەتوانێ له (عنصر)ی خۆتان (إنشا)تان کاتەوە، بە (نوع)ێ (دوام)ی (حیات)تان ببێ، (مراجعه)ی (علم)ی (کیمیا) کەن، ئەزانن چ (تطوّرات) بەسەر (عناصر) دادێ ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾ ئی حالّی (حاضرە) کاری (دنیا)، شتەکی لێ ئەزانن، (مجملاً) له چی (خلق) کران، چیتان بەسەرهات وەبوونە چی؟ ﴿فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ۝٦٢﴾ بۆ (نشأ)ەی (أخری)، با نەتوانن (تحریر)و (تقریر)ی کەن، لەو (نشأت)ە، (قوّە)ی (إدراك)، (مادّە)ی (حیات) لەناو (مادّە)ی (میّته) دانرایه، (إمتزاج)ی نەکردیه، گوێیا (محبوس)ە، (دائماً) خەریکی چوونەدەر، له (نشأت)ی (آخرَت) تێکەلاّو ئەبنو (إمتزاج) ئەکەن (أبداً) له بار یەك نایەنەدەر ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ۝٦٣﴾ ئەوەی ئەی چێنن، له (حبوبات) له ناوك، عارد ئەکێڵن، قوڵ هەلّ ئەقەنن، تۆی فڕێ ئەدەنێ، ناوکی قەیسی و خۆخ —(مثلاً)— ئەی هاوێنی، نەمامی تێ ئەچەقێنن،

(تمام)، ئەوانە (عائد)ی ئێوەن ﴿ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ﴾ ئەی ڕوێنن، شینی ئەکەن ﴿أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾﴾ کەس ناتوانێ بڵێ: ئێمە شینی ئەکەین" (دقّەت) کەن، دانەیی ورد ورد، وەکی تۆ چ دارێکی (عظیم)ی لێ پەیا ئەبێ، چ بەرێ ئەدا! (زێد)ە (علم)مان هەبێ، (تحیّر) ئەکەین، لەو (قوا)ی (عامله) کە تیایەتی، (کُلّ)ی دارەکی، (کُلّ)ی گەڵا گیایەکی، (عادةً) کارخانەیەکە پڕ لە (علم)و (عمله)، (دائم) خەریکن، (نباتات) (أصل)ی ئێمەیە، (عین)ی (قوا)ی (عامله) کە لەوان دایە، لە (حیوانات)یشدا (موجود)ە، (عمل)ی (عمله)ی (حیوان)، بە (قوّه)ی (مدرکه) (إمتیاز)ی هەیە لە مەیانی (حیوانات)، (إنسان) بە (قوّه)ی (عاقلّه) (ممتازه)، لە (قوای) (مدرکه) وەکی (حیوانات)ی (راقیه)یە، (مَعَ کل هذا) (إنسان) بۆ (تربیه)ی (نباتات)و (أشجار)و (حیوان)و خۆیان، (رکن)ێ گەورەیە، بەو (شرط)ە (إنسان) بێ، خەریکی (عمل)ی (نافع) بێ، (فائده)ی (عامّ)ی بۆ (بشر) بێتەڕێ.

لە (بعض)ە (کتب)ی (وعظ) دیومە، (حضرەتی إبراهیم) (مزرعه)ی ئاو ئەدا، (وەقت) نوێژ بە (عبادەت) (مشغول) ئەبوو، خوا لە ڕووی (مباهات) بە (ملائکەت)آنی ئەفەرموو: "بنۆڕەنە (عەبد)ی من خەریکی (حرث)ی (دنیا)و (آخرەت)ە." بەڵێ ئەبێ (مؤمن) وابێ ﴿لَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَٰهُ حُطَٰمٗا﴾ پاش شین بوون، (وەقت)ی پێ گەیین، ئەگەر خوا (إراده) کا، ئەی کا بە کاوو کۆت ئەبێتە پووش، ورد ئەبێ، بێ (خێر)و بێر ﴿فَظَلۡتُمۡ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾﴾ (تَفَكُّه) بە قسان ئەکەن، (مأیوس)ن، لە چەنابازی بەدەر، چیتان پێ ناکرێ، سەیری ناکەی ئەمە چ بوو؟ بۆ چی وای لێ هات؟ ئەگەر ژەنگی لێ نەدابا، دانی نە شکاندبا، ئەمساڵ، خەرمانی گەنمم، ئی فلان زەوی سەد عەلبەی ئەکرد، ئەوجا چی بکەین؟ بۆ نان و تۆو ساوارو بڕووش داندۆك و گەنمە کوتایی و ئالیکی ولاغان و شەرتی جووتیاران و چەند عەلبە سەلەمم لەسەرە، قەردارم، خۆم و منداڵم ڕووتین لێفەی سەر پشتیمان نیە، (تدبیر)ی؟ چەند

(معنا)یەکیان، لە (تفکّە) داوەتەوە لە (تفاسیر)آندا (مذکور)ن ﴿إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾﴾ (مُعَذَّب)و قەرداریین، (شکات)مان لێ ئەکەن، (حکوومەت) حەپسمان ئەکا ﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾﴾ بەجارێ خانە خوشتوورو ڕەنجەڕۆ، (إلهی) دووسێ ساڵە، حاڵی (مسلمان)آن، بە (أکثر)ی لە وڵاتی ئێمە وایە، ژەنگ لە دەغڵی ئەدا، گەرما دانەوێڵە ئەبا، هوڕە میوە ئەکولولێنێ، (شۆکە) لە داران ئەدا، بەری ئەفەوتێ، وەك وردە ڕەژووی لێ دێ، (مع أنّه) (إیمان)مان هەیە، بە (وحدانیەت)ت، بە ڕۆژی (جزا)، (إلهی) (رحم)ێ، لە (کافر)آن (إمتیان)ێ، ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾﴾ لە (بادیە)آن، (صحرا)و چۆڵ و هۆلان ﴿ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ﴾ لە هەوری ﴿أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾﴾ بەکێ ئەکرێ بەو تەرزە، باران ببارێنێ چیای و شیوە دۆڵان وێکڕا ئاودا؟ ئاودێری دێمەکاران، کەسی بێ کەس و هەژاران (تدابیر)ی (طبیعیە)، (طبیعی) هەمووی لە مەڕ ئەوە، ئاوی کانیانیش بە بارانێ (زیاد) ئەکا، ئەگەر کەم بباری (أکثر)ی وشك ئەبن، ئەگەر نەبارێ، هەمووی ئیشك ئەبێ. لە پیرانم بیستیە، ساڵێ نەباری، زێی کۆیە، وشك بوو، مەگەر (بعض)ە جێیە قووڵێ، گۆمەکەی مابووبێ، وە(إلا) هیشك بوو، چۆڕێ ئاوی پێدا نەدەهات، لە (حمە اغا)ی گەورەم بیست: ئەوێ ساڵێ قالۆچە هەندە زۆر بوو، لەلای زێیە دەهات، بە دەشتێوە وەردەبوو مەڕو بزن ئەیان خواردن، پێی قەڵەو بەشیر ئەبوون، (أما) شیریان مەیلەو سوور ڕەنگ بوو، ﴿لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا﴾ تاڵ و سوێر، (قابل)ی (شرب) نەبێ، (أساساً) ئاو تاڵ و سوێر نیە، بە (إختلاط)ی (موادّ)ی (أجنبی) ئەگۆڕێ، ئەمەش بۆ خوا (سهل)ە، ئەتوانێ لە ناو هەور ئەو (نوع)ە (موادّ)ە تێکەلاوکا ﴿فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾﴾ بۆ نای کەن، (حق) وایە لەسەر ئەو (نعمەت)ە، بێ (منّەت)ە، (دائم) (شکر)ی خوای بەجێ بێنن، (ثنا)ی خوا کەن ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾﴾ هەڵی ئەکەن، بە (أنواع)ی (متعدد) ﴿ءَأَنتُمْ

أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ﴾ (أصلی) ﴿أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾﴾ (أساس)ی (موادّ) (ناریّه)، (مُحْرِقه)و (مُحْتَرِقه) به (خلق)ی خوایه، (إنسان)یش به (کلّ)ی (وجه)ێ دروستی ئەکا، وه(تصرّف)ی تێ ئەکا، (حتّی) (قسم)ی زۆر له (بَدَن)ی (إنسان) (موادّ)ی (ناریّه)یه، (إحتراق) ئەکا، تا(حیات) مابێ، ئەسووتێ، که کوژاوه، (حیات) نامێنێ، دار (قسم)ی (أعظم)ی (موادّ)ی (ناریّه)یه ﴿نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً﴾ (تذکره)و (تبصره)یه، بۆ (ناری) (آخرەت)، ئەمڕۆ (علم) به أحوالّی (موادّ)ی (ناریّه) (محصولات) (کیمیاوی)، (موجب)ی (نوع)ه (تذکره)یه تره، کەسێ بزانی، ئاو له دوو ئاگر (مرکّب)ه، (عجبا) (إیمان)ی به (علم)و (قدرەت)و (صانعی) (کبریائی) (زێده) به (قوّەت) نابێ؟ (زێده) (تجبّر) ناکا؟ (زێده) (دەهشەت) نایگرێ؟ ﴿وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾﴾ ئەوانی له چۆلاّنن، یا (محتاج)، چ دەوڵەمەند، چ (فقیر)، (مدار)ی (عیش)ی (دنیا) لەسەر ئاگره، ئەگەر به (میزان) (صرف) کرێ، (لکن مع الأسف) ئەوڕۆ (دول)ی (راقیه)و (أمم)ی (سالفه)، (دار)یان کردیته، مایەی (تدمیر)و (تخریب) ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾ (سبحانك تبارك أسمك) (إلهی) (حال)م ئەزانی، (حاجەت) ناکا، بیڵێم: (سبحانك ربّی، علمك بحالی، حسبی عن سؤالی) ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾﴾ سوێند به (مواقع)ی ئەستێران ناخۆم، (مع أنه) شایانه، سوێندی پێ بخورێ ﴿وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ﴾ چۆنه، به چ (وضع)و (هندسه)یه دامەزراون! ﴿عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾﴾ گەورەیه، (دلالەت)ی (ظاهر)و (باهر)ی هەیه، لەسەر (وحدەت)ی (صانع)، ئەو (إنتظام)ه کاری یەك (ناظم)ه (عوامل)ی (مختلفه)ی نیه، ئەگەر ئارەزوو ئەکەی، شتێ له (إنتظام)ی (نجوم)و (بدائع)ی (صنع)یان بزانی، (مراجعه)ی (علما)ی (هیئەت)ی (جدید) که چ (إکتشافات)ێکیان کردیه؟ چ (أسرار)ی (غریب)و (عجیب)و (محیّر العقول)یان دەرخستیه! (سبحان الله) تا (دقائق)ی (کون)و (مکان) زێده دەر

ئەکەوی، ڕێی (شرك) زێدە ئەبەستریّ، (علما)ی (هیئەت) وایان (حقیقەت)ی (نجوم)ی دەرخست، کەس (توهّم)ی (تأثیر)و (تدبیر)و (ربوبیّەت)و (ألوهیەت)یان ناکا، (طنطاوی) خوا دوامی دا، لە (تفسیر)ی خۆی زۆر (مباحث)ی (نافع)ی (دائر) بە (أحوال)ی (نجوم)و (شموس)و (أقمار) (درج) کردیە. (جنابی حق) (أنە) سوێند بە (مواقع)ی ئەستێران ئەخوا، لەسەرچی؟ ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ﴾ (معروف)ە، لە (کرم)و (وجود)و (إحسان)و (بذل)ا، لە بەخشینە وەبێ (شك) (قرآنی کریم)، (منشأ)ی (خیرات)ە، (کلّ)ی (آیەت)ی بۆ (سعادەت)ی (بشر)، هەزار (یاقوت)و (زوبەرجەد)و (أحجار)ی (کریمە) دێنیّ، (مواقع)ی (نجوم)ی چ (حسب النزول) چ (حسب التدوین)، لە (مواقع)ی (نجوم)، (مربوط)و (منتظم) ترە، (أنە) (قوّەت)ی (تجاذب)یان لەناودایە بۆ یەکیان ئەبا، (میل)ی (شدید)یان پێ ئەکا ﴿فِي كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾﴾ (قبل النزول) (مثلاً) (لوح المحفوظ) (قرآن)ی تیا، (مصون)ە، وەکی (درّ)ی شاهواز (شیاطین)و جنۆکەی ناگەنیّ ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾﴾ (أرواح)ی (مقدّسە) پاك وخاوێن و بێ (حیلە)و (غلّ)و (غش) (بأيدي سَفَرَةٍ كرامٍ بَرَرَة) بۆ (صاحب)ی (رسالەت) دێ، (شیطان) چ (حدّ)ی هەیە، (حرف)ەکی باوێتە ناو. هەرچەند (شیاطین الإنس) بخوازن، شتەکی باوێنە ناو، (اما) (أصالەت)و (کرامەت) و (جزالەت)و (طهارەت)ی خۆی (قبول)ی ناکا، وەکی خەڕمۆرە لە مەیانی (درّ)و (یاقوت)و شەوچراغ ناشیرین و نارێك، بۆ (اهل)ی (ذوق)و (نظر) دەرئەکەویّ. (أما) (حمل)ی (کتاب) لەسەر (مصحف)، (طهارەت) لەسەر دەست نوێژ، (یعنی) ئەوەی دەست نوێژی نەبێ دەست نەداتە (حقیقە) (حمل)یّ نا بە (موقع)ە، ئەگەر بینۆڕیبا (مواقع النجوم) ئەو (حمل)ەی نەدەکرد، (لکن مع الاسف) (أوائل) ناتۆڕنە (موقع)ی (نجوم)ی (قرآن). (مسئلە)ی دەست نەدانی —بێ دەست نوێژ— بۆ (مصحف) با لە (حدیث) وەرگیریّ، یا خود بە (مناسبە) لە (آیەت) وەرگیریّ، (لکن طهارەت)ی (قلبی)

له (حق قران) گەرنەبێ، (طهارەت)ی (حسّی)و دەست و لاقان چ نیه، دەست نوێژ ئەشوا، وەکی (حاجی جلیل اغای حویزی زادە) (علی ملأ الناس) بە درۆ سوێندی پێ ئەخوا! ئەم دەست نوێژە چیە؟ چەندێ لەمەو پێش، کورد سوێندیان بە (قرآن) کەم ئەخوارد بە درۆ هیچ، وەئەیان گوت: "بەو (قرآن)ەی مێردی ئازای لێ ئەگەرێتەوە" (أما) لە بەروەی نەبوو، کە (قرآن) ﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ۝٨٠﴾ە، دیبویان گەلێ کەس بە سوێند خواردن، گرفتاری (بلا)ی بووبوون، بۆیە ئەترسان (أما) ئەمڕۆ ئەم ترسە نەماوە، (مع أنه) (أثر) ی دیارە، هەزار سوێندی بە درۆ، بە (قرآن)و خواو (صفات)ی ئەخوا، بەسەری (آغا)ی، بەسەری (شێخ)ی سوێندی ناخوا ﴿أَفَبِهَٰذَا الْحَدِيثِ﴾ ئەو (کلام)ی تازە (یعنی) (قرآن کریم) ﴿أَنتُم مُّدْهِنُونَ ۝٨١﴾ (تهاون)ی پێ ئەکەن، (حق) وایە زۆر (إعتنا)ی پێ بکەن، (إیمان)ی پێ بێنن، بە (آداب)ی (متأدّب) بن، پێی ببنە (إنسان)، لە مەیانی (نجوم)ی (أمم) (موقع)ەکتان هەبێ ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ﴾ (رزق)ی (حیات)ی (معنوی)، (روحی) ﴿أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ۝٨٢﴾ (بالقرآن وما فیه) ئەڵێن: "(کلام)ی خوای نیە، (إختلاق)ە، (أساطیر)ە" دوو (فرقە)ی (مخاصم)، یاخود لە یاری، ئەگەر کەسێ، ئیشی وابکا، (فرقە)ی خۆی ژێر کەوت، ئی (مقابل) سەرکەوی، ئەڵێن: ئەوە چەوریەیە، چەوری ئەکات" (واقعاً) ئەوانەی (تکذیب)ی (قرآن) ئەکەن، (مراد)یان ئەمەیە، (أمم)ی (أطراف) بە جارێ (إستیلا)یان کەن، بیانەکەنە (لقمە)یە چەورو بیان خۆن.

(مفسّر)ێ تەماشای (موقع)ێ (آیەت) بکا، (حمل)ی (آیەت) ناکاتە سەر (مُطِرنا بِنَوءِ کَذا)، با بەبەر (تکذیب)یشیان بکەوێ، (أنّه) خوا باران نابارێنێ، لە پێشەوە باسی باران باراندن کرا؟ هەرچەند بلێن: (أکثر) وا ئەفەرموون" وە(سبب)ی (نزول)ی بۆ (بیان) کەن، (لکن) (سیاق)و (سباق) لێ ناگەرێ، وەرێی (سبب)ی (نزول) —کە (نزول)ی بارانە— (جمع)ێ پێی (کافر) ئەبن،

ئەڵێن: بەپێرو (مثل)آن بۆمان باریوە" نادا (سیّدی آلووسی) بۆ (تصحیح)ی زۆر (سعی) ئەکا، (فأختَر لِنَفسكَ ما يَحْلو)، من (نظر) ئەکەمە (مواقع)ی (نجوم)ی (قرآن)، وەکی (مفتی) (دیاری) (روم)، (صاحب)ی (إرشادی عەقلّی سلیم) ﴿فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ﴾ (روح) ﴿ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾﴾ لەسەرە مەرگ، کە (رووح) ئەگاتە گەروو، ئەمەندەی نامێنێ، دەرچێ، دیارە وەکی (أکثر)ی (أهل)ی (علم) ئەفەرموون، (روح) شتێکە (داخل)ی (بَدَن)، (أما) (جوهر)ی (مجرّد)و (مقدّس) لە (جهەت)و (مکان)، گەرچی (أرسطو)و (جمع)ێ لە (علما)ی (أمّەت) وەکی (شێخ)ی (أبن سینا)و (غزالی)و (طوسی)و (کبار)ی (صوفیّە)، (قول)یان پێ کردیە، (لکن) (قول)ێ (واهی)یە، (موجود)ی (حقیقی) لە (عالم)دا، (موقع)ەکی نەبێ، بێ (وضع)و (تحیّز) بێ، (غیر)ی خوا کە (واجب الوجود)ە نیە وە(محال)ە، (ممکن الوجود)ی (لا فی حیّز ومکان) (مستحیل)ە، (ولاشك)ە ئەوانەی (مُخاطب)ن بەو (آیەت)ە، (خبر)یان لە (جوهر)ی (مجرّد) نەبوە.

﴿وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾﴾ ئەوانەی (دەورە)ی لێ ئەدەن، ئەی بینن، دەزانن، بە (قرائن) لە چ (حال)ێ ناخۆش دان ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ﴾ لە (مُحْتَضر)ی ﴿مِنكُمْ﴾ (قرب)ی (جسمانی) بێ (إدراك) (إعتبار)ی پێ نیە بە (قرب) (حساب) نیە، ئەوەی ئاگاداری (سر)و (علن)ە، ئەوە بە (حق) (قریب)ە، (ذاتاً) (أللهُ یَتَوفّی الأنفسَ حینَ مَوْتِها) لەم (کلام)ە (أقربیّەت) بە (إعتبار)ێ (رسل)، (یعنی ملك) (حقیقة) غیرە (مفهوم)ە ﴿وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾﴾ (إدراك)ی ئەمە ناکەن، کە خوا (أقرب)ە، لە (شؤون)ی (إلهی) (غافل)ن، (قوم)ێ (جاهل)ن ﴿فَلَوْلَآ﴾ (تأکید)ە بۆ (لَوْلا)ی (أولی) ﴿إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾﴾ (مربوب) نین، لە ژێر (إدارە)و ((سیاسەت)و (تدبیر)ی کەس نین، وەکی (زمخشری) ئەفەرموێ، یاخود ئەگەر (جزا) نادرێن، زیندی نابنەوە،

بۆ (حساب)و (کتاب) ﴿تَرْجِعُونَهَآ﴾ (روح)ەکە بۆ ناگێڕنەوە ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾﴾ لە (تکذیب)ی (قرآن)، (إنکار)ی خوا، (إنکار)ی (بعث). هەفتەیە زێتر، ڕاوەستام، تەماشای (تفسیر)ەکانم ئەکرد: (کشّاف)، (تفسیری کبیر)، (إبن جریر)، (إبن کثیر)، (نەیسابوری)، (إرشاد العقل السلیم)، (روح المعانی)، (حاشیەی شێخ زادە)، نەمدەزانی ئەم (ملازمە) چۆن ئەبێ؟ ئەگەر کەسێ، (إنکار)ی خوا، یا(بعث) کا، بۆ ئەبێ نەتوانێ، لە هەنگامی مردن (روح) بگێڕێتەوە (بدن)ی (صاحب)ی، نە (فلاسفە) نە (طبیعیّون) نە (أطبّاء) ئەو (إدّعا)یە ناکەن، وە بە (إلتزام)یش ناچێتەوە سەریان، تا (إلزام)یان دەین (حتّی) (طبیب) ئەزانێ (علاج)ی (بعض)ێ (أمراض) (قابل) نیە، ئەڵێ: پاش دوو (سعات) –(مثلاً)– تەواو ئەبێ، (إعادە)ی (قوّەت)و (حیات)ی لای بە (محال)ە" (کفّار)ی (قریش)، (قوم)ی (جاهل) چ ئاگایان لە (قول)ی (فلاسفە)و (أطبّا)و (طبیعیَون) هەیە؟ (مع هذا) ئەوان (إنکار)ی خوای ناکەن، بە (نظر)ی (ظاهری)، کە ئەیلێنێ، (سطحیّاً) ئەڵێن: "هێسکی رزی چۆن زیندی ئەکرێتەوە؟" وەهەم ئەگەر کەسێ لەوان بڵێ: "ئەگەر مردن و ژین بە دەست خوایە، خوا ئەتوانێ مردیان زیندی کاتەوە، با لەو (وەقت)ە (روح)ی ئەو (بشر)ە بگەڕێتەوە، (جواب)مان چیە؟" (الجواب): هەرچەند (طبیعیَون) (إنکار)ی (روح) ئەکەن، ئەڵێن: (حیات)لە (إمتزاج)ی (عناصر) پەیا ئەبێ، کە (مزاج) بە (فساد) چوو، (حیات) نامینێ، وە(عود)ی ناکا" (لکن) (حکما)ی (إلهیّون) وەکی: (سقراط)، (أفلاطون)، (ارسطو)، (فارابی)، (إبن سینا)، بە (دلائل)ی (قویّە)ێ (ردّ)ی ئەم (قول)ەیان کردیە، (واقعاً) (عەقل)ێ قبوڵی ناکا، ئەو (حیات)ە ئەو (سرّە) (مکنونە) بەو (آثاری) کە هەیتی، (مجرّد) لە (إمتزاج)ی (عناصر) بێ، (لا شك) (مبدأ)ێ (جوهر)ی پێ ئەوێ،(روح) لە (نظر) (سقراط)و (أفلاطون) وەکی (أکثر)ی (علما)ی (إسلام)، لایان وەیە، (جوهر)ێ (لطیف)ە، (داخل)ی (بدن)ە، (قبل البدن) بوە، وە(بعد الفراق) ئەمێنێ،

ئەوەی (عاقل)و (بالغ) بوویێ، (مکافات)و (مجازات)ی (معنوی) ئەبینیێ، (أما) (إعادەی) (هیکل)ی (إنسان) لای وانیە، (لکن ملیّون) لایان هەیە. لە گەلیّ (موقع) (قرآن) ئەفەرمویێ: "ئەوەی ئێستا لەو (عناصر)ی (مختلفه) (إنسان)ی دروست کرد، ئەتوانێ لەو (عناصر)ە (إعادە)ی (هیکل)ی بکاتەوە، (روح)ی بهاوێتەوە بەر" (إنکار)ی دوو (إنکار)ە: (إنکار)ی (لسانی) –بێ (سند)و (ثبت)– ئەمە هیچ نیە، (إنکار)ی (عن دلیل وبرهان) وەئەگەر (علوم)ی (عملی) بێ، بە (تجربە)، کەوابێ ئەوانە (إنکار)ی (ما في القرآن) ئەکەن، یەکێ لە (مسائل)ی (علمیه) (بحث)ی (إماتە)و (إحیا)یە، ئەگەر لە خوایەوە نیە، (نسبەت)ی بۆ هەرچی بدەن، ئەبێ بە (تجربە)یە (عمل)ی (إثبات)ی کەن، وە(معکوساً) ئەبێ (إظهار) کرێ، (مادام) ئێمە ئەڵێین: (إماتە) لە (طرف) خوایە، ئەوەی (إنکار)ی ئەکا، ئەبێ (بالمقابلە) نەیەڵێ (روح) بڕوا، بی گێڕێتەوە (کأنه) ئەمە (نوع)ێکە، لە (برهان التمانع). ئەوەی لە (إعتقادیات) (تابع)ی (هوا)ی (نفس) نەبێ، دەبێ، بە (حجّە)و (عمل) (مُعْتَقَد)ی خۆی (إثبات) کا، وە (إلاّ إنسان) هەرچی، هەوەسی لێ بێ، ئەیڵێ، تووخوا ئەگەر (میل)یّ (سفیهان)ە نەبێ، (إنسان) ئەبێ چ (إعتقاد) بە گاجووت، یا بە هیکلی بەردی تاشراو بکا، بە چ (وجە) (سجدە)ی بۆ ئەبا؟ کەسێ لە (إنکار)و (تکذیب)ی (صادق) بیَ، (لازم)ە، (تشبّث) بە (دلیل)و (برهان)و (حجّەت) بکا، وە(إلاّ) دەرئەکەوێ، لە (تکذیب)آ، (کاذب)ە، ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ﴾ ئەوەی (وفات) ئەکا، (روح)ی لە گەرووی دەرئەچێ، (إنتقال)و (عود)ی (علی المبدأ) جوانە، بێ (تکلّف)ە، (حقاً) (نظم)یّ زۆر (غریب)ە ﴿مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾﴾ لە (سابقین)آنە، (سابق)ی (إلى الخیرات) بێ ﴿فَرَوْحٌ﴾ (راحەت) ﴿وَرَيْحَانٌ﴾ (رزق)، (عصف) نیە، کاوو پووش و پەلاش بۆ چیە؟ چی ئەکا، لە (جنّەت)؟ ﴿وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ (کما سبق) ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾﴾ (قوّەت)و

(خێر)و (برکەت) ﴿فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ٩١﴾ چەند (وجوه)یان بۆ ئەو (لَكَ) فەرمووە: (حُسن)و (لطیف)ی لای (سیّدی آلووسی)، (وجه)ی (ثالث)ە، کە (فخر الدین والدنیا) (إمامی رازی) فەرموویەتی: ئەو (جملە) (إفادە)ی (عظمەت)ی، (حال)یان ئەدا، لە (عبارات)ی (قوم) (واقع) ئەبێ، (ناهیك بە)، (حَسبُكَ أنه فلانٌ)، (إشارە)یە بۆ ئەوە (ممدح)ێکە، (فَوقَ حدّ الفَضل)." ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ٩٢﴾ (يَجعَلونَ رِزقَهُم أنهم يُكَذِّبون) (أصحاب) (شمال)، (شوم)و بەدیوم وبێ (خێر)و بێرو، پڕ شەڕو شۆڕو گومڕاهو خانە خوشتوور ﴿فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ٩٣﴾ لەسەر (زَقّوم)، بە سندانی بێ، ڕەشاوی ئەکا ﴿وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ٩٤﴾ لە (قبر)آ، لە (قیامەت) ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾ ئەوەی (ذکر) کرا، لەو (سورەت)ە، ئەو (تقسیم)ە، ئەو (مجازات)و (مکافات)ە ﴿لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ٩٥﴾ (شكّ)و (شبهە)ی تیانیە ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ٩٦﴾ وەکی کوردی ئەڵێ: گەورەیی (لائق)ی تووە، (إلهی)" (تَنَزُّه) لە (نقائص)ی (خاصّ)ی ئەوە، (باقی) (ممکن)ە، (إمکان) خۆی (نقص)ە، وە(أساس)ی (نقصان)ە (سَبَّحَ ما في السَماوات والأرض) هەموو (تنزیه)ی (كبریائی) ئەکەن، تووش (علی الدوام) (تقدیس)ی کە، دیارە ئەم (سورەت)ە چەند (مربوطه). (بعض)ێ (روایەت) ئەکەن خوێندنی ئەم (سورەت)ە، بۆ دەوڵەمەندی چاکە، وە(حتّی) گەلێ کەس لە بەریان بوو (أما) ئێستا کەم کەس لە بەریەتی، خۆزی (سورە)ی (حجرات)یان لەبەر کردبا، بۆ (دەوڵەمەندی)و (دنیا واخرەت) باشە، مایەی (سعادەت)ی (قیامەت)ە، (تفسیر)ی (سورە)ی (واقعە) تەوابوو.[1]

[1] - ڕۆژی دوو شەموو (٢٩)ی (صفر)، مارتی رومی، (٢٦) نیسانی ئەفرەنجی، (٨) ١٣٥٩هـ/١٩٤٠م.

(سورة الحدید)

نۆبەی (تفسیر)ی (سورەی الحدید)ە (مکیه)، (مدنیه) (خلافیه)، بۆ ئێمە (تأثیر)ی نیه، (عدد)ی (آیات)ی (٢٨) یا (٢٩)یە.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ (أنه) تێکڕا، بەیەك (زوبان)و (زمان) (تنزیهی) بۆ (کبریائی) ئەکەن بۆیە نافەرموێ: (وما في الأرض) ئەوەی (ناطق)و (مؤمن)ە، بە (لسان)ی (قال)و (حال)، ئەوانیدی بە (لسان)ی (حال)، (تقدیس) بۆ (کبریائی) ئەکەن، خۆی (مقدّس)و (منزّه)ن، ئێمە نای کەین، بۆیە ئەفەرموێ: "لله" (تقدیس)ی (جهل)ی چ نیە، (أكثر)ی (بشر) (تقدیس)ی گاوو (أشباه)ی ئەکەن، (لکن) (مقدّس) نیە، هەر گاجووتە، هەر کەرە، (کلّ)ی (موجود)ی، لە (موجودات)ی (طبیعیه)و (مادّیه)، (شاهد)ی ئەدان کە (جنابی حق) دوورە، لە (أحوالات)ی (طبیعیه)و (مادّیة)، وەهەم (مقرّ)و (معترف)ە، کە خوداوەندی (عظیم) (الشأن) (فوق الطبیعی)یە بە (کمال) (کلّی) (ذاتیّ)و (صفاتی)و (أفعالی) (منفرده)، (مناسبه)ی (ذاتیه)ی لەگەڵ هیچ (موجود)ێ نیە، (حاشا) هەرچەند (مناسبه) ئەبێ لە (بین)ی (معلوم)و (علّەت) ببێ، (أمّا) (مناسبه)ی (ذاتیّ)، (ذات)ی (واحد)ی (أحد) لەگەڵ (غیر)ی چۆن (تصوّر) ئەکرێ؟ (بدیع)ی (سماوات)و (أرض)، (إظهار)ی (صنع)ی خۆی ئەکا، بە (کمال)ی (علم)و (قدرەت)ی (ترقّی) بە خۆڵ ئەدا، بۆ (جهەت)ی (کمال)، تا بە (تطوّرات) ئەی کا بە (إنسان) (تقدّس) لە (نقص)، لەمە (زیاد) تر (خیال) ئەکرێ؟ ناء ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ﴾ (قادر)ی (غالب)ە ﴿ٱلۡحَكِيمُ ①﴾ (عزّەت)و (حکمەت) وێکڕا گردببنەوە خۆیەتی، گەلێ کەس بە (قوّەت)و (قدرەت)ن، (أما) بێ (حکمەت)ن، (أرباب)ی (حکمەت) (ذاتا) بێ دەسەڵاتن، بۆیە (مجدد)ەکانمان، (حتی) (حضرەت)ی (شافعی) چی پێ نەکرا، بەڵێ، (ملا)یە (تام)، (ملا)یە بە (عزّەت)و (قوّەت)و شکۆهو (نافذ الکلمة)، ئەتوانێ (تجدید)ێ

بکا، (قوّەت)ی (علم)، لەگەڵ بێ هێزی و (فقیری)و (مسکنی) چێ پێ ئەکرێ؟! (فقیری) (علم)ێ (تحریر) ئەکاتە ژێر دەستی کەرێ ﴿لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ (مالك)ی (حقیقی) ئەوە، (تصرّف)یان تیا ئەکا (کیف یشاء)ن بێ (معارض)و (مقابل) ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ﴾ ئەژێنێ، ئەمرێنێ ئەگەر بروا ناکەن، پێشکەیە (خلق) کەن، (روح)ێ لە رێ دەرچوو، دەبیگێڕنەوە ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ (شيء)ێ (مناسب)ی (شأن)ی (ألوهیەت)و (ربوبیّەت) بێ ﴿قَدِيرٌ ۝٢﴾ (مادام) لە (دائرە)ی (إمکان)دا بێ، ئەتوانی بیکا (عاجز) نیە ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ﴾ (مبدأ)ی (وجود)ە، (موجود)ی (قبل کلّ)ی (موجود)ە، (أما) (أول)ێ نیە، (داخل) یا (سلسلە) لەوێڕا دەست پێ بکا، (واجب الوجود) نابێتە (أول)ی (سلسلە)ی (ممکن الوجود)، (وکذا مبدأ)ی (کلّ)ی شت، (غیر)ی ئەو شتە ﴿وَٱلۡأٓخِرُ﴾ (واجب الوجود) (قابل)ی (فنا)نیە، ئەوەی (ممکن) (الوجود) بێ، (دائماً) لە (معرض)ی (زوال)ە، (ولو دائم الوجود) بێ، (ممکن) بێ (ملاحظە)ی (علّەت)ی (وجود)، بۆنی (وجود) ناکا (ألا کلُّ شی ما خلا اللهُ باطلٌ) ﴿وَٱلظَّٰهِرُ﴾ (ذاتاً) (ظهور)ی (أشیا) لەوی یە (الله نور السماوات والأرض) (کائنات) لە (نفس)ی خۆیان دانین، (ظاهر)ی (بالذات)، (مظهر)ی (بالغیب) ئەوە، لە (نظر)ی (عەقڵ) (وجود)ی (جنابی حق)، زۆر (ظاهر)ە، (عەقڵ) (قاصر) نیە، (عەقڵ) بە (کمال)ی خۆی ئەزانی، خوای (تعالی)ن (درك) ناکرێ ﴿وَٱلۡبَاطِنُۖ﴾ (کنە)ی (قابل)ی (إدراك) نیە، هەرچەند (حکما)و (متکلمین)و (صوفیّە) (جبر) لە (عەقڵ) ئەکەن، بۆ ئەو (جهەت)ە، ناچێ، ئەزانێ سەرەدەری ناکا (لکن) (میل) لێ یان ناگەرێ، ئەو (میل)ە، (ولو) بەناوی (معرفة الله) بێ لام باش نیە، (والعجز عن دَرك الإدراك، إدراكٌ) (تمام) (نەدانم چی یی هەرچی هەستی تویی) (لوازم)و (خواصّ)ی (ألوهیەت)و (ربوبیەت)و

(وجوب)ی (وجود)، بزانین، (کافی)و (وافی)یە، (حواسّ)ی (ظاهرە)و (باطنە) (درك)ی خوای پێ ناکرێ، لە (مقولە)ی (مبصرات)و (مسموعات)و (مذوقات)و (مشمومات)و (ملموسات) نیە، (وهم)و (خیالّ)ی چی ئەکەن؟ خودا بەو (نوع)ەی (حیوانات) یەکدی دەبینن، نابیندرێ، وەبەو تەرحەی نابینی، (رؤیة الله تصویر) ناکرێ، (أشاعرە) هەرچەند ئەڵێن: خوا لە (جنّەت) ئەبیندرێ" (لکن) بەو (نوع)ە (رؤیەت)ە، نا.

(ذوقی إبن مەی نەشوناسی بە خودا تا نەچەشی) تانەی بینی نای زانی، ئەو (وەقت)یش نازاندرێ، (حالّەت)ی (مَحْوِیَە) (مُجَسَّمە) قسە لە خوا ئەکەن، (أما) نازانن ئەڵێن: "چی؟" (حکمەت)ی (إلهی) تێ ناگەن، (فرق) لە (بین)ی (طبیعیات)و (ما فوق الطبیعەت) ناتوانن، وابزانم (سیاسەت)ەکیان هەیە لە (قول) بە (تجسّم)ی (کبریائی)، (إدراك)ی (ماهیّات) بە (حواس) ناکرێ چونکی (إنسان)و (حیوان) لە (إدراك)ی (حسّی) (شریك)ن، (إبن جنّی) ئەفەرموێ: "(مجاز) لە (لوغەت)دا، (غالب)ە، ئەڵێ: "زیدم دی" (مع أنه) هەمووت نەدیتیە" (ملا)یانی ئێمە (واقعاً) (ملا)ن، (أما) (بعض)ە قسەیان خۆی نیە، لەم (کلمات)ە قسەیان زۆرە ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ۝٣﴾ (علم)ی وی (ذات)یە، (علم)ی وی (حضوری)یە، (علم)ی وی (علم)ێ (عملی)یە (یعنی) (صانع) (کنە)ی (أشیا) بە تەواوی ئەزانی، لە (علم) بە (قواعد)ی (طبیعی)، (صنع)و (إیجاد)ی فەرمووە، (علم) لە (غور)ی (أشیا) (نفوذ) ئەکا، بە (باطن)ی (حقائق)دا ئەڕوا (قەترە)یە (منی) ئەزانی (أجزا)ی چیە، وەچەندە چی تێ ئەبێ؟ چۆنی تێ ئەبێ؟ (لقمە)یە خواردن (تقسیم) ئەکا، لەسەر ئەو هەموو (أعضا)ی (مختلفە)، (حقّاً) (مجبّرە)! چونکی (علم)ی (محیط)و (مقتضا)ی (ذاتی) (صمدانی)یە، بۆ (غیر)ی ئەو نابێ، (محالّ)ە، وەپێشی نابەخشرێ (صفات)ی (کبریائی) (مدخل)ی (إختیار)ی تیا نیە. (مسئلە)یە لە (مسائل)ی (حکمەت)و (کلام)، بۆ (هدایەت)و (حسن)ی (إعتقاد)، (دنیا)و (ما فیها) ئێنێ،

کە زانانْدت، (جنابی حق) (واجب الوجود)ە یا بڵێی" (وجود)ی (ضروری)یە، (مقتضا)ی (ذات)ی خۆیەتی، وە(ماعدی)ی ئەو هەرچی هەبێ (ممکن الوجود)ە" ئەزانی (أول)و (آخر)ە ناتوانی بڵێی: "ئەدی کێ لە پێش خودایە؟" کە زانانْدت (علّەت بالذات) (مقدّمە) لە (معلول) —(ولَو بالزمان)— وێکڕا بن، (تقدّم)ی (ذات)ی (کبریائی) لەسەر (کائنات) بە تەواوی (فهم) ئەکەی، ناتوانی (خیاڵ) کەی خوا خەڵکی (خلق) کردیە، ئەدی کێ (خالق)ی خوایە؟ (علم) لەگەڵێ (جهالات) (إنسان) ئەگێڕێتەوە، ئەگەر (میل)ی (فاسد) لێ گەڕێ، (أما) (میل) —(نعوذ بالله) لە (میل)ی (فاسد)— (عەقل)و (علم)و هۆش و گۆش نایەڵێ. ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ (علوی)و (سفلی)، هەمووی ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ خوا ئەزانی چ (نوع)ە (یوم)ێکەن؟ دیارە یەك شەموو، دووشەمووی خۆمان نیە، ئەوانە پاش (خلق)ی (أرض)و (شمس)و (دوران)یان (وضع) کراین، ئەگەر (کلام) لە (منظومە)ی (شمس)ی ئێمە بێ، (تعیین)و (تحدید)ی (وقت) —(نوعاً ما)— (سهل)ە، لەو (مدّە)ش کەس نەبوو (مشارکە)ی لەگەڵ بکا ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ﴾ (کأنە قرار)و ئارامی گرت، بێ (إضطراب) ﴿عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾ لەسەر ئاوڕەنگی جهان، (بانی)ی یەکە، بێ (معارض)و (مزاحم) ﴿يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ هەرچی بێ ﴿وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا﴾ (لکن) ئێمە، لەوەی لە عەردی دێتەدەر، (غافل) بووین، حتا نەوتی (بابا گوڕ گوڕ)یمان —(مع الاسف)— نەدەزانی، (مع أنه) (لازم) بوو، —(حسب الإیمان)— بە خوایە، واداناو (عالم) ئێمە زۆر شتی بزانین، لەو (خزائن)ەی کە لە عەردی دێتە دەر، (إستفادە) بکەین ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ﴾ خوایە (خلق)ی (کائنات) بە شەش ڕۆژ بکا (صاحب)ی ئەو (علم)و (قدرەت)و (علم)ە بێ، (شریك)ی بۆ چیە؟ چ هەیە، (شریك)ی بکا؟ ﴿وَهُوَ مَعَكُمۡ﴾ بە (علم)و (قدرەت) ﴿أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ﴾ لە هەر شوێنێ بن، لێتان (غافل) نیە، ئەزانی چی ئەکەن، چی ئەڵێن،

لەو (آیەت)ە دەرئەکەوێ (إستوی) بە (معنی) دانیشتن نیە، (سلف)و (خلف) ئەم (آیەت)ە (تأویل) ئەکەن، بە (معیّە)ی (علمی)، چونکی (معیّە)ی (علمی)، چونکی (معیّەت)ی (ذاتی) (محالە)، کەوابێ (لازم)ە هەر (آیەت)و (حدیث)ێ (معنا)ی (ظاهری) (محال) بێ، (تأویل) بکرێ، (معنا)ی نیە، هەر ئەوەی (سلف) (تأویل)یان کردیە، (قبول) بکرێ، (باقی) (تفویض) بێ، (أساساً) پاش (توسع)ی (عەقل)، (توسّع)ی (تأویل) (ضروری)یە کێ لە (أرباب)ی (عقول) بە (تفویض) (راضی)یە؟ وەهەم (تأویل)ی (حدیث)ی –(الحجر الأسود یَمین الله في الأرض)یش ئەکەن–، (لاشك) ئەم (حدیث)ە بێ (أصل)ە، (وَما قَدَروا الله حق قدره والأرض جَمیعاً قَبْضَتُهُ یوم القیامة والسموات مطویّات بیَمینه) چۆن (جنابی رسالەت) بە (حجر الأسود) ئەڵێ: "(یمین الله)؟" (ولو) (مراد)یش (معنا)ی (ظاهری) نەبێ، (تعظیم)ی (حجر)ی رەش بە (تحقیر)ی خوای چۆن ئەکرێ؟ ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ۝٤﴾ ئەوە (شاهدە) (مراد) (معیّەت)ی (ذاتی) نیە، (علمی)یە، (رؤیەت)ی (ظاهری) چی وانیە، (درك)ی (مزایا) خۆیەتی، (بصر)ی بێ (بصیری) ئی (حیوانات)ە ﴿لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ (زوال)ی نابێ، نە ئەوە چۆن بوە، هەروائەبێ ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ۝٥﴾ (أول)و (آخر) ئەوە، کەسی تر نیە، هەرچی هەیە، ئەچێتەوە بەر دەستی ئەو (مجازات)و (مکافات) هەر (عائدی) ئەوە، ئیتر، ئیتر چی؟ هیچ ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ﴾ رۆژ درێژ ئەبێ، شەو کورت ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۚ﴾ شەو درێژ ئەبێ، رۆژ کورت، (علم)ی (هەیئەت)، بۆ زانینی ئەو (نوع)ە (آیات)ە زۆر (معین)ە، (نافع)ە، (علی أفندی هەولێری) لە (حق) (شێخ علی حسام الدین) ئەڵێ: "(علی) (مُکَوِّر اللیل) و (النّهار) است" ئەگەر ملایە علمی (فلکی) با، نەیدەتوانی ئەو قسە بکا. لەو (بین)ە (شێخ حسام الدین) وفاتی کرد، دورو (دەلاب)ی (فلك) هەروەکی خۆیەتی. (سبحان الله) لای خۆیان ئەوانە، وەکی کوردی ئەڵێ:

"(طریق) وەرنەگرن، بۆ (وصول)ی (إلی الله) کەچی تووشی (کفریّات)ی وادەبن"، وەبە (عین)ی (إیمان)ی ئەزانن! ﴿وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٦﴾ بە (مکنونات)و (مضمرات)ی (قلب)ی، کە لەناو سینگی دایە، (حتی) (دائر) بە (إختلاف)ی (لیل)و (نهار) چیان لە دڵی دایە، ئەیزانی، وە لە (علم)ی (جناب)ی (باری) (فرق)ی ڕۆژو شەو (ظاهر)و (باطن) نیە (هو الظاهر والباطن وهو بكل شيء عليم) ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (إیمان)ی (صحیح) بێ (غلّ)و (غش) ﴿وَأَنفِقُواْ﴾ بۆ خوای ﴿مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾ (کأنه) (وکالەت)ی (جنابی حق) (تصرّف)ی تێ ئەکەن (المال مال الله والعباد عباد الله) لە ماڵی خوا بۆ خوا (صرف) ئەکەن یا (خلفا)ی (أمم)ی (سابقە)ن، وەکی (سعدی) ئەڵێ:

( چونانکی دست ب دست امدست ملك ب ما

ب دستهای دیگر هم چونان بخواهد رفت )

ئەمڕۆ، تا سبەی لە دەستت دەڕوا، بۆ لە ڕێی خوا (صرف)ی ناکەی؟ (زمخشری) هەردوو (معنا)ی (ذکر) کردیە، (اما) وەکی (سیّدی آلووسی) ئەفەرموێ: "(معنا)ی (أول) لەگەڵ (مقام) (أنسب)ە" ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَأَنفَقُواْ﴾ (فی سبیل الله) ﴿لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ۝٧﴾ (معلومە) ئەوانەی لە (أوائل)ی (تشکیل) (صرف)ی (ماڵ) ئەکەن، تا (أبد) (أجریان) نابڕێ. (بعد الإیمان) (أنفاق)ی بەجێ، لە هەموو (عبادەت)ێ (خێر) ترە، بێ (صرف)ی (ماڵ) هیچ کارێ سەر ناگرێ، کورد —(لا حیا فی الدین)— (حکومەت)یان (تشکیل) کرد، (أما) هەر کەس ئەچوو،(دەوڵەمەند)و (رأیس)و (صاحب)ی (قدرەت)و (مُکنەت) ئەیان ووت: "(معاش)مان دەنێ" کەس نەبوو، (قەمەری)یە، لە ڕێی (حکومەت) (صرف)کا، (آخر)ی بۆف دەرچوو، ئەبایە، هەموو (ماڵ)و (روح)یان لەسەر دەستیان دانابا، تا بە تەواوی (نائل)ی (مرام) ئەبوون. وادەرئەکەوێ — مع الأسف— (ملا)ی (فقیر) لەم (أجر)ە (کبیر)ە (محروم)ە، خوا بکا (إیمان)ی

(سلامەت) بێ، (کافی)یە، ئێوەو خوا، لە (آدم)ی تا ئەمڕۆ، (فقیر) چی پێ کراوە؟ وەچی پێ ئەکرێ؟ (ذَهَبَ أهل الدُّثورِ بالأجور) وایە، دەوڵەمەندی (دنیا)و (قیامەت) ئەو دەوڵەمەندەیە، بەجێو ڕێی (مال) لە ڕێی خوا (صرف) کا، کون و کاژێرکان بگرێ، (أما) بە ناوی (دین) لە (سفاهەت) (صرف) کردنی (مال) (ضرر)ێ گەورەیە. ئەگەر (إسلامەتی) (ملا)ی خانەدان و بە (قوّەت)و دەوڵەمەندی هەبا، قەت وا سووك نەدەبوو، (علم) —(دائماً)— پەرلاغ ئەبوو، (رؤسا)و (أمرا)ی کلکە کوتێیان بۆ ئەکردن، (تجار) ئەبوونە خزمەتکاریان ئەگەر خوا چارەیە ئەکا، ئەوەندە (رمق)ی مایە، ئەوەندیش نامێنی ﴿وَمَا لَكُرْ﴾ (أيها الناس) ﴿لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ بۆچی (إیمان) بە خوای نایەنن؟ ئەگەر سەریەخۆ (وقوف)تان پێ نابێ ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ﴾ (دعوەت)ی (ظاهری) بە (بیّنە) ﴿لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ﴾ (ربّ)ی (حقیقی) خۆتان ﴿وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ﴾ (عهد)و پەیمانتان، پێش (دەعوەت)ی (رسول) (عەقل)و هۆشی خۆتان (کافی) بوو، بۆ (إیمان) بە خوای، (فوق الکل، علی الاقل) ئەوەندەتان ئەزانی، ئەم کەروگایانە (تمثیل)ی (صانع)ی ئێوە ناکەن، (لکن) (عەقل)یان لێ تێکدان، (مشوّەش)یان کردن، (رسول) هات، (کید)و فێڵی (رؤسا)یانی بۆ دەرخستن، (إزالە)ی (أوهام)ی کردن، چ (عذر)تان نەما، بۆ (إیمان) نەهێنان ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٨﴾ ئەگەر (لأي مجبر) (إیمان) بینن، بۆ (إیمان) نایەنن؟ (مقتضی) (موجود)ە، بێ (مانع)، بە(غیر)ی (تقلید) چی ترتان بەدەستەوە نیە، (أما حمل)ی (أخذ میثاق) لەسەر (ذریّەت)ی (ظهر)ی (آدم) وەکی (إمام) ئەفەرموێ: (قول)ێ (ضعیف)ە. ئەوانەی (إیمان)یان بە خواو (رسول) نەبێ، ئەمە نازانن، وەگەمەیان پێ دێ، (مع أنە) (معنی)ی (حقیقی) بۆ (آیەت)ی (وإذ أخذ ربّك من بني آدم من ظهورهم ذُرِّيَتَهُم... الآية) (ظاهر) بوە، لە (موقع)ی خۆی (بیان) کرا ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ﴾ (عبد)ی (خالص)، بێ (میل)ی

(سوء) ﴿ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ﴾ (قرآن) (معجزه)ی (شرح)ی (آیات)ی (أکوان)ی ﴿لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ (کفر)و (جهل) ﴿إِلَى ٱلنُّورِ﴾ (ایمان)، (علم)ی (عمل)ی (صالح) ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٩﴾ لەبەر (زێد)ە (مرحمەت)ی (رسول)ی بۆ (هدایەت)ی ئێوە، ناردیە. (معتزلی) هەرچەند ئەڵێن: "(إرسال)ی (رسول)ی خوای (واجب)ە" لای وانیش (وجوب)ی (ذاتی) نیە، (وجوب)ێ (مقتضی)ی (صفەت)ی (لطف)و (رأفەت)ە، (ذات)ێ (متصف) بێ بە (صفەت)ێ، ئەبێ (مقتضی)ی (إجرا) بفەرموێ ﴿وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بۆچی لەرێی خوا (إنفاق) ناکەن؟ ﴿وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ ئەوی لە ئاسمان و ئەرزی دایە (میرات)ە بۆوی، هەمووتان ئەڕۆن، ماڵتان لە دوا جێ ئەمێنێ (کەس نەیارەد زوپەس توو پێش فروست) لە رێی خوا (صرف)ی کەن. (ملّەت) بە (صرف)ی (ماڵ) لە (أمور)ی (خیریە)و (نافعە) بۆ (بقا)و (دوام)ی (قوم)ی، ئەبێتێ، وە ئەبێتە (میرات) گری (أقوام)ی دی.

﴿لَا يَسۡتَوِي مِنكُم﴾ ئەولنی (حاضر) لە (زمان)ی (خطاب) ﴿مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ﴾ (ظاهر)ە لە (فتح)ی (مکّە)، (صلح)ی (حدیبیە) هەرچەند بە (فتح) (حساب) کرا، (لکن) (مقدمە)ی (فتح)ی ڕاستی بوو، ئەوەی پێشی (فتح)ی (مکّە) (ماڵ)ێ لە ڕێی خوا (صرف) کردبێ ﴿وَقَٰتَلَۚ﴾ بۆ (إعلا)ی (کلمە) خەریکی (جهاد) بووبێ، لەگەڵ ئیدی (مساوی) نیە. (خدمەت)ی (أوائل)ی (نشأت) لەگەڵ (خدمەت)ێ (زمان)ی (قوّەت)، (قیاس) لێك ناکرێن. لە پاش (زەمان)ی (سعادەت) زۆر (وقعە)ی وا، بەسەر (أمّەت) هاتوە، (إنفاق)و (جهاد) لەو (وەقت)ی، تا(دفع)و (رفع)ی دوژمن کرایە، وە(أمّەت) جێی خۆی گرتیتەوە گەلێ لە (فوق)ی (إنفاق)و (قتال)ی دوایە بوە، دیارە (السّابقون السّابقون، أولئك المقربون) کە (جناب)ی (رسالەت پەناە) (وفات)ی کرد، (عەرەب) وا تێك چوون، ئەو (مسلّمان)انەی (سعی)یان کرد، تا(أمّەت) (قرار)و

ئارامی گرتەوە، (قیاس)یان لە ئیدی کو ئەکرێ؟ (حتی) وەك (شێخ سعدی) ئەفەرموێ:

(دوست آن باشد کی گیرد دستی دوست
در پریشان حالی و درماندگی)

(سبحان الله) (مسلمان) چەند (غافل)ن، ئەمڕۆ لە ولاتی ئێمە (علوم)ی (دینیە) —معاذ الله— لە (إنقراض)ە، کەس غەمی نیە، زرم و هۆڕ بە دەفەودونبەلەك (مولود)آن ئەکەن، کاك حاجی بۆ ناوو ناوبانگ، دووسێ حج ئەکا، کە (علم) لە ولاتی نەما، (حاجیەتی) مام (حاجی) چ کەلك ئەگرێ؟ ئەوەی (خدمەت)یش ئەکا، خزمانی پێ بەڕێوەدەبا، (مقصد)ی (إدامە)ی (علم)ی نیە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ﴾ (منزلە)و (قدر)یان گەورەترە، پایەیان بلندترە ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ﴾ دوای (فتح) ﴿وَقَٰتَلُواْۚ﴾ (فی سبیل الله) (غزا)یان کردیە ﴿وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ (ثواب)و (جزا)ی (إحسان)یان، بەگوێرەی ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ۝١٠﴾ە (ظاهر)و (باطن)یان ئەزانێ، ئاگادارە.

(إیمان)ی (حضور)ی ئەگەر بۆ (مؤمن) (میسّر) بێ، زۆر باشە، لە (نفاق)ی لە (ریا) پاکی ئەکاتەوە، لە گوناهانێ ئەگێڕێتەوە هەر ئەڵێین: "خوا (حاضر)و (ناظر)ە" (لکن) لە دڵماندا (حضور)ی نیە، بێ (أثر)ە، بە (أدنی) (میل)ێ لەو (إیمان)ە (غافل) ئەبین.

(فضل)ی (أصحاب)ەی (رسول الله)ی (إنکار) ناکرێ، لەسەر (أمّەت) (لازم)ە بە (کمال)ی (إحترام) ناویان بێنن، نە ئەوان بکەینە (عدّو)ی یەك، نە ئێمە بە ناوی وان ببین بە دوژمنی یەك. ئەگەر (إعتراض)مان لێیان هەن با ئازا بین، کارێ وابکەین، ئێمە (إعتراض)مان نەیەتە سەر، (تلك أمه قد خلت) ئەگەر دەسەلاتم هەبا، باسی شەڕو شۆڕو (مخالفات)یانم لە (کتب) (محو) ئەکردەوە. (حقیقةً) باس و خواسێ (مضّر). ئەگەر (أرباب)ی (حدیث)و (إجتهاد) (بحث)یان لە (عدالەت)یان کردبێ، لەبەر (خصوص)ی (قبول)ی (حدیث) بۆ

وان قەی ناکا، ئەوا رابرد، بۆ ئێمە ئەمەش نیە، بێ (لزوم)و (مضر)ە، هەر (طَیْ) بکرێ باشە ئێمە بەو هەموو بێ (دینی)یە چۆن بە (خراپ)ە، ناوی (مهاجر)و (أنصار) بێنین؟ سەر و (مالْ)و (أولاد)و ئارام و (راحەت)یان دابە (دین)، بە (عزّ)ی (إسلام)، (إعلا)ی (کلمە)ی (توحید)، (شیعە)کان، چی؟ (طوسی) (مالْ) وێران، لەسەر ئەم هەموو (خیانەت)ە، کە لە (حق) (إسلامەتی)ت کرد، (طعن) لە (أبوبکر)و (عمر) ئەدەی؟ (إسلامەتی) وائەبێ؟ (حاشا). ئەمڕۆ کەسێ بۆ (وەحدەت)ی (مسڵمان)آن (سعی) بکا، لام وەیە، بە (قد) (سابقین)آن (خێر)ی ئەگاتی، خوا بە (مرحەمەت)ی خۆی (علاج)ی بکا، تا دێ (تفرقە) (زیاد) ئەبێ!

(صاحب المعالی)، (حسین هیکل) (محاورە)یە (نقل) ئەکا، کە لە (بین)ی (عکرمە)و (حضرەتی خالد)ی (جریان)ی بووە، (خالد) (مسڵمان) ئەبێ، (عکرمە) ئەڵێ: "تۆ چۆن (إیمان) ئێنی بەو (ذات)ە؟ چۆن (شرف)ی بابی بردی لە (بدر)؟ مام و ئامۆزای کوشتی" (خالد) ئەفەرموێ: "ئەمە (حمیّە)یە (جاهلی)یە، (لکن) من (مسڵمان) بووم، (وەقت)ێ (حق)م بۆ (ظاهر) بوو" وەپێشیان ئەفەرموێ: بە (حقّەت) (تبیّن)ی کردیە، بۆ هەر کەسی (صاحب)ی (عەقلْ) بێ، کە (محمّد) (ساحر)و (شاعر) نیە وە(کلام)ی لە (کلام)ی (ربّ العالمین)ە، (حقّ)ە لەسەر (کلّ)ی (ذی لب)ێ، (یعنی) (کاملْ) دڵێ، (تبعیّەت)ی بکا." ئەو (إیمان)ە هونەرە، (محض) بۆ (إتّباع)ی (حقّ)ە، ئەم خوێنە، ئەم (عداوەت)ە فرێدا، لەسەر (قدرەت)و (قوّەت)و (عزّەت) ئەوها (إیمان) بێنێ. کەسێ (إنصاف)ی هەبێ، دەر (حق) ئەوانە زوبان درێژی ناکا.

﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى﴾ کێیە؟ ئەوکەسەی ﴿يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ (دقّەت) لەو (آیەت)ە (کریمە) کە، چ (مجاملە)یە (لطف)ێکە تیایە، بۆ (إنفاق)ی (فی سبیل اللە)، کە (محضاً) بۆ خۆیانە، بۆ (نیل)ی (سعادەت)ە (عبد)ی خوا، (مالْ)ی خوای، بداتە خوای خۆی، بە قەرد، لە پاداشی ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ﴾ دووچەندانە

بۆی (زیاد) ئەکا ﴿وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ١١﴾ (ممدوح)و پەسەند دیدەو شایانە، کەی ﴿يَوۡمَ تَرَى﴾ (خطاب) بۆ (جنابی رسول)ە (ألبته) (أمّەت)ی خۆی ئەناسیٚ، بە (آثار)و (علائم) ﴿ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ ئەوانەی (صاحب)ی (یدی) (بیضا)ن ﴿يَسۡعَىٰ نُورُهُم﴾ (نور)ی (حقیقی)، کە (منشأ)ی وی (نور)ی (معنوی)یە، (إیمان)و (أیادی)و (إحسان)ە، ئەبینی (نور)یان ئەگەڕیٚ ﴿بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ﴾ لە (بین)ی دەستیان ﴿وَبِأَيۡمَٰنِهِم﴾ بە دەستی راستیانەوە، (تَموّج) و (فیضان) ئەکا، دیارە تا (ید)ی بە (قوّەت) تر بیٚ (نور)ی زیاتر ئەڕوا. کەسم نەدیوە بەو (آیەت)ە (دلیل) بیٚنی لەسەر (حرکە)ی (نور)، (قدما) (خلاف)یان هەیە، (أما) (متأخرین)ی نویٚ، (متفق)ن لەسەر (حرکە)ی (نور)، وە(حرکە)ی زۆر (سریعە)، بە شەش حەوت (دقیقە) ریٚی سیٚسەد سالٚ، بە (حرکە)ی (قطار) ئەبڕیٚ، وە(أساس)ی (حرکە)ی لەمەڕ (أثیر)ە، ئەوا ئەبیەین، بە (تموّجات)ی (قصیری) بە (آن)یٚ (صوت) لە (لۆندەرە) ئیٚنیٚتە کۆیە، (حقیقة) (رسل)ی (طبیعەت) (معجزات) ئەنویٚنین (أئمە)ی (أدیان) لەسەر ئەو (حالٚ)ە، باز خەریکی کۆنە (خرافات)ن، درۆو مرۆی (قدّیس)آن ئەهۆننەوە، (رسول)ی نویٚیەکانیش –(مجبوراً)– گەردەنیان بۆ کەچ ئەکەن. قەت ئەبیٚ (رسول)ی خوای دوای (قول)ی (طبیعیّون)آن کەوی؟ هەمووی بیٚ (حیا)ییە، (وإلّا) ئەمڕۆ (مقابل)ی ئەو (دُهامات)ە، بەچی (دەعوا)ی (رسالەت) ئەکەن؟ (ممکن)ە (نور)ی (بعض)یٚ (افاق)یٚ رووناك بکا، (طبیعی) (درجات) (متفاوتە) وە(آثار)یش ئەی گەیەنیٚ، وە(ممکن)ە ئەوانە دوو (فرقە) بن، (سابقین) وە(أصحاب الیمین) دیارە (نور)ی (سابقین)آن (سعی) زیاترە، (کتیٚب) بە (یمین) وەرگرتن، (نور)ی (یمین) زیاد ئەکا، (مانع) نیە (تفسیر)ی (نور)، بە (ثواب)ی (إیمان)و (عمل)ی (صالح)، وە(تقدیر)ی (کتب)ی (أعمال)، دوای (بأیمانهم) لام خۆش نیە، گەرچی پەسندیدەی (إبن جریر)ە، وابزانم لەگەلٚ

